Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings

وەزارەتی پەروەردە

# پەروەردەی ئیسلامی

## پۆلی دووەمی بنەڕەتی



حکومەت... — عیراق
وەزارەت...
بەڕێوەب... و چاپەمەنییەکان



Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings

# پەروەردەی ئیسلامی
# پۆلی دووەمی بنەڕەتی


ئامادەکردنی

عبدالله عبدالرحمن عبدالله — عبدالجبار محمد شريف
خواجه طه شاهين — محسن جمال احمد البرزنجی

پێداچوونەوەی زانستی

د.بشير خليل توفيق — ابو بكر علي كاروانی

وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی

صادق عثمان عارف — عبدالله بابان

پێداچوونەوەی زمانەوانی

صادق ئەحمەد عوسمان روستایی


چاپی دووەم — ١٤٣٧ کۆچی — ٢٧١٦ کوردی — ٢٠١٦ زایینی

بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

## پێشەکی

ئەم پەرتوکە هەنگاوی دووەمە لە پرۆژەی گۆڕینی پەرتوکەکانی پرۆگرامی پەروەردەی ئیسلامی، بۆ هەردوو قۆناغی بنەڕەتی و ئامادەیی، مامۆستایان تێبینی هەندێک گۆڕانکاری و جیاوازی دەکەن بە بەراورد لە گەڵ پرۆگرامی پێشوودا، چونکە لە خستنە رووی بابەتەکانی خوێندن شێوازی چیرۆک و گفتوگۆ پەیڕەو کراوە بە مەبەستی نزیککردنەوەی وانەکان لە مێشکی قوتابیانەوە لەم قۆناغە گرنگەی خوێندن.

لێرەدا تکا لە بەڕێزان خوشک و برا مامۆستاکانمان دەکەین شێوازی بەشداری پێکردنی قوتابییان لە وانەکاندا پەیڕەو بکەن چونکە ئەوە مەبەستی ئێمە بووە لە داڕشتنی بابەتە زانستییەکەو شێوازی راهێنانەکان، گومانیشمان لەوەدا نیە کە بەڕێزان خوشک و برا مامۆستاکانمان هیچ درێغی ناکەن لە گەیاندنی پەیامی پەروەردەیی لەم بابەتە زۆر گرنگەدا، چونکە ئەرکی ئێمە وەک ئەندامانی لێژنەی ئامادەکردنی پەرتووکەکە لە گەڵ ئامادەکردنی پەرتووکەکە تەواو دەبێت و ئەرکی پیرۆز و گرانی بەڕێزان خوشک و برا مامۆستاکانمان دەست پێ دەکات.

داواکارین لە یەزدان کە ئەرکەکەمان بە سەرکەوتویی ئەنجام دابێت و بەڕێزان خوشک و برا مامۆستاکانمان ئەرکەکە تەواو بکەن بە گەیاندنی ئەم زانیارییانەی لە دوتۆی ئەم پەرتووکەن بە جگەر گۆشەکانمان.

داواکارین خودای گەورە هەموو لایەکمان سەرکەوتوو بکات.

لێژنەی ئامادەکار

# سڵاوکردن

## وانەی یەکەم



دانا بەهاوڕێیەتی بەختیاری برا گەورەی چوونە فرۆشگەیەکی نزیکماڵەوەیان بەمەبەستی کڕینی چەند پێداویستیەک، کاتێک گەیشتن.

بەختیار بەم جۆرە سڵاوی لەخاوەن فرۆشگەکە کرد:السلام علیکم.واتە: سڵاوی خواتان لێبێت.

خاوەن فرۆشگە: وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاتە. واتە سڵاو و رەحمە ت و میهرەبانی خودا لەسەر ئێوەش.

بەختیار داوای لەدانا کرد تەوقە لەگەڵ پیاوەکە بکات، بۆیە داناش دەستی راکێشاو تەوقەیان کرد.

لە گەڕانەوەدا بەختیار گرنگیی سڵاوکردن و وەڵامدانەوەی بۆ دانا روونکردەوە، لە ئاینی ئیسلامیشدا وەک ئەرکێک بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی نێوان موسڵمانان، ئاماژەی پێدەکرێت، پاشان رونیشی کردەوە کە سڵاو کردن کاتی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە دەبێتە مایەی خێرو خۆش گوزەرانی و خۆشەویستی نێوان ئەندامانی خێزان، هەروەها ئەم ئەرکە رێسای خۆی هەیە، بۆ نموونە:

بچوک دەست پێشخەری سڵاوکردن لەگەورە دەکات هەروەها سوار لە پیادەو، وەستاو لە دانیشتوو، تاکیش لە کۆمەڵ. سلاوکردنیش سوننەتێکی ئیسلامە، بەڵام وەڵامدانەوەی ئەرک و پێویستە. ئەم ڕێسایەش پێغەمبەرمان (دخ) لە فەرموودەیەکدا روونی کردۆتەوە، کە دەفەرموێت: (يَسلِّم الرَّاكبُ على الماشي والماشي على القاعد والقليل على الكثير).

### گفتوگۆ:

- سڵاوکردن لە ئیسلامدا چۆنە ؟
- وەڵامی چۆنە؟
- ئایە وەڵامدانەوە ئەرکە یان نا؟

### چالاکی:

بۆشاییەکانی خوارەوە بە دەستەواژەی گونجاو پڕبکەوە:

لەڕێساکانی سڵاوکردنە کە .......... سڵاو لەگەورەو ..........

لەپیادە و، وەستاو لە ............ و ............ سڵاو لە کۆمەڵ بکات.



# پاراستنی موڵکی گشتی

## وانەی دووەم



پاش ئەوەی مامۆستای پەروەردەی ئیسلامی چوە پۆل لەبەر ئەوەی وانەکە سەبارەت موڵکی گشتی وپاراستنی بوو، سەرەتا ئەم پرسیارەی ئاراستەی قوتابییان کرد: قوتابییانی ئازیز مەبەست لە موڵکی گشتی چییە؟

شیرین وتی: فەرمانگە میریەکان ، کەلوپەلەکان، باخە گشتیەکان دەگرێتەوە.

مامۆستا: ئافەرین بۆ شیرین، کێ شتی دیکەشمان پێ دەڵێت؟

هانا: هەموو ئەو دەزگا خزمەتگوزاریانەش دەگرێتەوە کە سوودیان بۆ هاوڵاتیان هەیە و میری سەرپەرشتیان دەکات.

مامۆستا: ئەی باشە، کێن ئەوانەی میری و دەسەڵات پێکدێنن؟

ئارام: وەزیرەکان وکارمەندانی دیکەی دەوڵەت.

مامۆستا:ئایە ئەو شتانەی لەسەرەوە باسکران تەنها موڵکی ئەوانن، یان هی گەلن؟

سارا: بەڵکو، هی گەلن، چونکە گشت تاکەکان سوودمەندن لێیان.

مامۆستا: دەستخۆش، راستە چونکە موڵکی گەلەو لەخزمەتی رۆڵەکانی گەلدایە.

شوان: مامۆستای بەڕێز، کەواتە هەموو کەرستەکانی ناو قوتابخانەش بۆ هەمووانە.

مامۆستا: بەڵی کورم. میری هەموو ئەو کەرستەو دەزگا و باڵەخانە وباخچانەی بۆ خزمەتی هاوڵاتیان دەستە بەرکردوە، ئەرکی پاراستنیشیان لە ئەستۆی ئێوەدایەو کارێکە خودای

گەورە پاداشتان دەكات لە سەری و هەروەها زیان پێ گەیاندنیان لە ئیسلامدا حەرامە چونكە زیان بە بەرژەوەندییەكانی تاك و كۆمەڵ دەگەیێنێت.

**گفتوگۆ**

- ئامۆژگاریت بۆ هاوڕێكانت چییە، كاتێك پێكەوە دەچنە باخی گشتی؟
- ناوی هەندێك لەو كەرستانە بژمێرە كە بەشێكن لە موڵكی گشتی.
- ئاسەواری پاراستنی مولكی گشتی چییە؟

**چالاكی:**

**بخوێنەو بنووسە:**

خاوێنی قوتابخانەكەم وگشت كەرەستەكانی دەپارێزم.

**نزا:**

خودایە... نیشتمانمان لە گشت كێشەو ناخۆشیەك بپارێزە.

**ئامانجی وانەكە:** قوتابییان فێری واتای موڵكی گشتی و گرنگی بۆ تاك و كۆمەڵ چییە دەكرێن و پێویستە بپارێزرێن وەك ئەركێكی ئاینی و نیشتمانی.



# گرنگی زانست و فێربوون له ئیسلامدا

وانەی سێیەم



ماموستـــا: کەسی خوێندەوار باشترە یان نەزان؟

ئـــازاد : ئەو کەسەی خوێندەوار بێت باشترە.

ماموستـــا: ئێوە بۆ چی هاتوون بۆ قوتابخانە؟

شـــیریـــن: بە مەبەستی فێربوون و پەروەردە بوون.

ماموستـــا: چی فێر دەبن؟

شـــۆرش : زمان و زانست و زانیاری و بیرکاری.

ماموستـــا: بۆ چی فێر دەبین؟

موحەمەد: بۆ ئەوەی رۆڵێکی گرنگ بگێرین لە ژیاندا و وڵات و نیشتمان پێش بخەین و لە خودا نزیک ببینەوە.

ماموستـــا: کێ ئایەتێکی قورئانمان دەربارەی گرنگی زانست بۆ دەخوێنێتەوە؟

دلـــشـــاد : ((وقُل رَّبِّ زِدْني عِلمًا)).

بـــەختـیـــار : ((قُل هَل يَستَوِي الَّذين يعلمون والَّذين لا يَعلَمونَ)).

ماموستـــا: کەواتە زانایان پلەیان لە لای خودا بەرزە.

ماموستـــا: کێ فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان (د.خ) بۆ دەڵێت کە هانمان دەدات بۆ بە دەستهێنانی زانست؟

ســـالار : پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی:((طَلَبُ العِلم فَريضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ ومُسلِمَةٍ)).

واتە:هەوڵدان بۆ بە دەستهێنانی زانست ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانانە، هەروەها

فەرموویەتی::«(مَنْ سلك طريقًا يَلتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سهَّلَ الله لهُ طَرِيقًا الى الجَنَّة).
واتە:هەر کەسێک ڕێگەیەک بگرێتە بەر بۆ بە دەستهێنانی زانست، خودا ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.

## گفتوگۆ:

١ — باسی هۆیەک بکە لە هۆیەکانی بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری.
٢ — ئارەزووی فێربوونی چیت هەیە؟

## ڕاهێنان:

**نیشانەی (√) بەرامبەر دەستەواژەی ڕاست دابنێ و نیشانەی (×) بەرامبەر دەستەواژەی هەڵە دابنێ.**

١ — ئیسلام بە دەستهێنانی زانستی کردۆتە ئەرکی سەر شانی هەموو موسڵمانێک.
٢ — پێغەمبەر (دخ) موسڵمانانی هانداوە بۆ فێربوون.
٣ — نەزانی یەکێکە لە هۆکارەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵ.
٤ — ئەرکی سەر شانمانە هەموو کەسێک هاندەین بۆ چوونە قوتابخانە.
٥ — ئیسلام پێشبرکێی نێوانمان بۆ فێربوونی زانست کردووە بە ئەرکی سەر شانمان.

ئەم وشانە بخەرە بۆشاییە گونجاوەکان:
(زانست — ئەرکە —خێزانێکی — خزمەت)

١ — بە دەستهێنانی زانست .......... لە سەر شانی هەموو موسڵمانێک.
٢— ........ ڕێنیشاندەرمانە بۆ پەرستن و گوێرایەڵی خودا و پێغەمبەر(دخ).
٣ — زانست ......... بە گەل و نیشتمان دەگەیێنێت.
٤ — ئەو منداڵەی لە ....... خوێندەوار پەروەردە بکرێت پێشدەکەوێت.

بینوسەوە:

اقرا وربك الاكرم الذي علم بالقلم

..................................
..................................
..................................

نزا :
خودایە لە زانست بەشم زۆر بکە.

ئامانجی وانەکە:
گرنگی زانست و هەوڵدان بۆ بە دەستهێنانی لە هەموو سەردەمێک و جێیەکدا بۆ قوتابییان روون دەکرێتەوەو چۆن زانایان بە هۆی زانستەکەیانەوە پلەیان لە نەزانان بەرزترە، هەروەها هەوڵدان بۆ بە دەستهێنانی زانست ئەرکە لە سەر شانی موسڵمانان، چونکە بە دەستهێنانی هۆی سەرکەوتن و پێشکەوتنی ژیارییە.



# خاوێنی وپاکژی

وانەی چوارەم



مامۆستا: قوتابییە ئازیزەکان. هەموو دەزانین، ئاینی ئیسلام گرنگیەکی تایبەتی بە پاکژی داوە، کێ لە ئێوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) لەو بارەیەوە دەڵێت؟

سەردار: پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: ((تَنظَّفوا فإن الإسلام نظيفٌ)).

واتە:خۆتان خاوێن رابگرن، چونکە ئاینی ئیسلام خاوێنە و خاوێنی دەوێت.

مامۆستا: خودا بتپارێزێت، دەستان خۆش، ئەی چۆن جەستەتان پاکژ رادەگرن؟

هێرۆ: بە شوشتنی دەستەکانمان پێش ودوای خواردن.

شێرکۆ: هەروەها بەشوشتنی روخسارو لەشمان.

ئەحمەدیش وتی:شوشتنی ددانەکانیش پێش خەوتن، بەشێکە لەو پاکژیە.

مامۆستا: هەموی راستە، سوپاستان دەکەم. ئەی پاکراگرتنی شوێنەکەتان چۆن دەبێت؟

شیلان: بەوەی خاشاک بخرێتە جێی دیاریکراو بۆ ئەو مەبەستە.

لەیلاش گوتی: پێویستە، لەسەر دیوار و مێزەکانی خوێندن نەنوسین.ویارمەتی دایکمان لە خاوێن کردنەوەیماڵەوە بدەین.

شیلان : پێویستە دەبێت بایەخ بە پاکژی جل و بەرگیشمان بدەین.

مامۆستا: ئافەرین، بۆ هەردووکتان.بەڵام تەنها ئەمانەن کە دەبێت خاوێنیان بپارێزین؟ بێگومان نەخیر رۆڵەکانم، چونکە ئاینی پیرۆزمان داوامان لێ دەکات دەرونیشمان بە خاوێنی رابگرین.

موحەمەد: مامۆستا مەبەست لە خاوێنی دەرون چییە؟

مامۆستا: دەبێت دڵمان خاوێن بکەینەوە لە هەموو جۆرە رق و کینەیەک و پرپیکەین لە چاکە خوازی و خۆشەویستی بۆ خەڵک.

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە دەستەواژەی گونجاو پڕبکەوە.

١- پێش ودوای خواردن هەردوو دەستم ....... .

٢- شوشتنی ............. پێش نوستن پێویستە.

٣- ......... فرێنادەمە سەر ڕێگەو بان.

بینوسەوە:

جوانی لە خودای گەورەوەیەو هەموو جوانیەکیشی خۆشدەوێت.

................................ ................................

................................ ................................

................................ ................................

چالاکی

بەهاوکاری یەکدی، مامۆستاو قوتابییەکان، گۆڕەپانی قوتابخانەکە پاکژ بکەنەوە.

ئامانجی وانەکە:

خاوێنی پرسێکی گرنگە لە پێگەیاندنی نەوەکان، چونکە لە زەحمەتییەکانی چارەسەرکردن دەیانپارێزێت، هەروەها ئەو ئەرکە لە سەر شانی کەس و کاریان کەم دەکاتەوە، بۆیە پێویستە لەم وانەیەوە هەنگاو بنێن بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی پیرۆز ئەویش پێگەیاندنی نەوەیەکی هۆشیارە لەم بوارەدا، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر بایەخدانی ئاینە پیرۆزەکەمانە بەم پرسە گرنگەی ژیان لە هەردوو لایەنی مادی و مەعنەوییەوە و وەک چۆن خاوێنی دەرونیش پێویستە بۆ بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی و تەبایی لە نێوان خەڵکدا.

# چەند ئاكارێكی پێویست بۆ قوتابی موسڵمان

## وانەی پێنجەم

١ – ئازاری خەڵک نەدات بە زوبانی و بە دەستی، وەک پێغەمبەرمان (دخ) دەفەرموێت: ( (المسلم من سلم المسلمون من لسانه ویده)) واتە: موسڵمان ئەو کەسەیە موسڵمانان لە زیانی زوبان و دەستی سەلامەت بن.

٢ - گوێرایەڵبێت بۆ دایبابی و زویریان نەکات.

٣ - ئامۆژگاری مامۆستاکانی لە گوێ بگرێت و پەیڕەوی بکات.

٤ - (لەخۆوە) دەستکاری کەرەستەو کەلوپەلەکانی قوتابخانە نەکات

٥ – یارمەتی هەژاران و لێقەوماوان بدات.

٦ - ئەرکەکانی ئەستۆی بەدڵسۆزی جێبەجێ بکات.

٧ – ئامۆژگاری هاوڕێ و خزمانی بکات و ڕێی چاکەیان پێشانبدات.

### چالاکی

قوتابییانی خۆشەویست هیوادارین پابەند بن بەو چەند ئاکارەی سەرەوە.

ئایە دەتوانیت هەندێک ئاکاری جوانی دیکەمان بۆ بژمێریت کە دەبێت موسڵمان پەیرەویان بکات.

### ئامانجی وانەکە:

قوتابییان ئاشنا بکرێن بەو ئاکارانەی ئەگەر پەیڕەویان بکەن دەبنە هۆی بەختەوەریان و هەڵگرتنی ئاکاری موسڵمانی چاک.

# چیرۆکی سەوزە فرۆش و کوڕەکەی

## وانەی شەشەم



جوامێر،پیاوێکی گوندنیشین بوو، سەوزەی لە جوتیارەکانی گوندەکە دەکڕی و دەیبردە شار بۆ فرۆشتن. ڕۆژێک کوڕەکەی لەگەڵ بوو بۆ یارمەتیدانی، تێبینی کرد باوکی سەوزەی کۆن و نوێ تێکەڵدەکات بۆیە پێی گوت: بابە گیان، ئەوە کارێکی حەرامە، واتە خودا قەدەغەی کردووە وسزات دەدات لەسەری. باوکی گوتی: نامەوێت گوێم لەو وشانە بێت و ڕێنادەم دەست لەکاری من وەردەیت. کەسیش هەست بەو تێکەڵکردنە ناکات.

هانای کوڕی گوتی: باوە گیان، ئەی خودای بەئاگا نامان بینێت! بێگومان دەمانبینێت و چاودێرە بەسەرمانەوە لەهەر جێیەک بین. ئەم وتەیەی هانا کاریگەری لە باوکی کردو پەشیمان بوەوەو داوای لێخۆشبوون و چاوپۆشی لە خودای میهرەبان کرد. پاشان سوپاسی کوڕەکەی کرد لەسەر ئاگادارکردنەوەی لەو هەڵەیە.

**چەند پەندێک لەم چیرۆکە:**

١- فریودان قەدەغەو حەرامەو، زیان بەکەسانی دیکە دەگەیێنێت و متمانەی نێوانیان ناهێڵێت. پێغەمبەری خودا محمد (دخ) فەرمویەتی: (( من غشَّنا فليس منَّا )). واتە: (ئەوەی فریومان بدات لە ئێمە نیە).

٢- پێویستە ئامۆژگاری کەسانی دیکە بکەین لە فریودان وفێڵکردن دووربن، چونکە دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە بەرژەوەندی کۆمەڵگە.

**گفتوگۆ**

١- مەبەست لە دەستەواژەی (لە ئێمە نیە) چییە؟

٢ - بۆچی ئیسلام فریودانی حەرامکردووە؟

**راهێنان**

**نیشانەی (√) بەرامبەر دەستەواژەی راست دابنێ و نیشانەی (×) بەرامبەر دەستەواژەی چەوت دابنێ:**

١- نابێت موسڵمان رێبازی فریودان بگرێت چونکە حەرامە.

٢- لەسەر موسڵمان پێویستە پابەند بێت بەراستگۆیی لەگشت کردار و گوفتارێکدا.

٣- مرۆڤی دەست پاک کەس فریو نادات.

٤- یەکێک لە شێوازەکانی فریودان (تێکەڵکردنی شتی خراپە بەباش وفرۆشتنی بەنرخی باشەکە).

**چالاکی:**

فەرموودەی: ((مَنْ غشَّنا فَلَيْسَ مِنَّا)). **بنووسەوە.**

# وشەی جوان و باش

## وانەی حەوتەم

مامۆستا: قوتابییانی خۆشەویست، هەموومان پێغەمبەرمان (د.خ) خۆشدەوێت چونکە ڕێنمایی کردوین بۆ هەموو کردەوەیەکی چاک وبەسوود، کە خودا پێی رازی بێت. جا کام لە ئێوە سەبارەت بە ئاکارو وشەی جوان بۆمان دەدوێت.

شنۆ: ڕاستگۆیی و دوورکەوتنەوە لە درۆو قسە هێنان وبردن.

ئەحمەد: ڕێنماییکردنی مرۆڤەکان بۆ هاوکاری وخۆشەویستی یەکدی.

راز: هاندانی قوتابییانیش بۆ کۆشش وهەوڵدان لەخوێندندا.

شوان: هاوڕێیانت ئامۆژگاری بکەیت کەتێکەڵ بەخراپەکاران نەبن.

نەسرین: قسەکردن لە گەڵ خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان بە سۆز و میهرەبانییەوە.

مامۆستا: دەستان خۆش بێت، نموونەکان باشن و دەبنە هۆی خۆشەویستی کەسانی دیکە بۆمان. هەموو ئەو کردەوە باشانەی ناوتان هێنا دەبنە مایەی پاداشتی خودای میهرەبان بۆ خاوەنەکانیان. پێغەمبەری ئازیزمان (د.خ) فەرموویەتی: ((الكلمة الطيبة صدقة)).

واتە: وشەی باش و جوان خێری تێدایە بۆ خاوەنی و خودا بە چاکە بۆی دەنوسێت.



### ڕاهێنان

ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە:

١- وشەی بەسوود ............ دەنوسرێت لە لای خودا.

٢- چاکە تەنها بەماڵ و دارایی ناکرێت بەڵکو بە ............ش دەکرێت.

### لە کردەوە چاکەکان:

١ – ڕاستگۆیی و دوورکەوتنەوە لە ..............

٢- ڕێنماییکردنی خەڵک بۆ............

٣- هاندانی قوتابییان بۆ .........

٤- ئاراستەکردنی هاوڕێیان بۆ ...........

### چالاکی:

ئەم فەرموودە پیرۆزە چەند جارێک بنووسە:

((الكلمة الطيبة صدقة))

.........................................

.........................................

.........................................

### ئامانجی وانەکە:

قوتابییان ئاشنا بکرێن بەو کارە چاکە زۆرانەی مرۆڤ دەتوانێت ڕەزامەندی خودایان پێ بە دەست بێنێت، تەنانەت ئەگەر ئەو کارە تەنها وشەیەکی خۆشیش بێت.

# کردەوەی چاک



وانەی هەشتەم

ئیسلام ئاینی لێبوردەیی و بەهاو ڕێزلێنانە، هەمیشە هاندەرمانە بۆ کاری چاک لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵگەکەمان و تەواوی مرۆڤایەتی، خودای پەروەردگار فەرموویەتی: ((وافعلوا الخير لعلكم تفلحون)) (الحج ٧٧). کەواتە کاری چاک گرنگە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان تاکەکانی خێزان بە تایبەتی و کۆمەڵگەش بەگشتی.

بەم وشانە سیروان ئامۆژگاری ئاراستەی منداڵەکانی کرد، پاشان لێی پرسین: خۆشەویستانم بێگومان ڕۆژانە زۆر کاری چاکەتان بەرچاو دەکەوێت کەسانێک ئەنجامی دەدەن، جا کام لەئێوە ئاماژە بە دیمەنێک دەکات جێی سەر سوڕمانی بووبێت.

دڵشاد: باوە گیان، ئەم بەیانیە لاوێکم بینی دەستی نابینایەکی گرتبو تا لەشەقامەکە بیپەڕێنێتەوە.

شیلان: منیش قوتابییەکم بینی لەناو ئۆتۆمبێلی گواستنەوەدا جێی خۆی بەخشی بە پیاوێکی بەتەمەن تا دانیشێت.

کاروانیش گوتی: سالاری هاوڕێم ئەمرۆ بەردەکانی سەر ڕێی قوتابخانەی لادەدا.

باوکیان: خودا تەمەنتان درێژکات، ئەوانەی ئاماژەتان پێکرد هەندێکن لە کردەوە چاکەکان، کە ئاینی ئیسلام بانگەشەیان بۆ دەکات تا پلەو پاداشتی خاوەنیان بەرز ببێتەوە، پێغەمبەریشمان موحەمەد (د،خ) دەفەرموێت : ((كلُّ معروفٍ صدقةٌ)).

واتە:

هەموو چاکەیەك خێرو پاداشتی هەیە.

## راهێنان

ئەم بۆشاییانە پڕبکەوە :

ئاینی ئیسلام بانگ بۆ......... دەکات .

هەموو کارێکی چاک و ناسراو دەبێتە پاداشت و......... بۆ خاوەنەکەی لای.... .

## چالاکی

١- هەندێک کردەوەی چاکە بژمێرە .

٢- هێڵ بکێشە لە نێوان دەستەواژەو وشە گونجاوەکەی بەرامبەر:

| | |
|---|---|
| ١- راستگۆیی کردەوەی | چاکە |
| ٢- درۆزنی کردەوەی | چاکە |
| ٣- گوێ رایەڵی دایباب کارێکی | خراپە |
| ٤- فریودان کارێکی | چاکە |
| ٥- بە هانا چونی هەژار کارێکی | خراپە |



# شاناز و خوشکە زیرەکەکە

## وانەی نۆیەم

سازان و شاناز ی خوشکی لە ناندینەکە قاپیان دەشوشت لە بەر ئەوەی دایکیان نەخۆش بوو، شاناز لە سازانی پرسی: ئەمڕۆ لە قوتابخانە چیت کرد.

سازان وەڵامی دایەوە و گوتی: ئەمڕۆ لە وانەی پەروەردەی ئیسلامی سورەتی (الناس)مان خوێند، مامۆستاش داوای لێکردین ئەم سورەتە لە وانەکەدا لەبەربکەین، منیش توانیم لە بەریبکەم و هەستام لەبەر گوتمەوە لە پۆلدا، مامۆستا زۆر سەرسام بوو لەو خێراییەی من لە لە لەبەرکردندا بۆیە داوایکرد لە هەموو قوتابییەکان چەپڵەم بۆ لێدەن!!

شاناز گوتی: دەست خۆش خوشکەکەم، ئەوەی کردوتە نیشانەی زیرەکی و دلسۆزیە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی قوتابخانە، ئەمەش شتێکی دڵخۆشکەرە.

کاتێک هەردوو خوشک کارەکانیان تەواوکرد دایکیان سوپاسی هاوکاریکردنیانی کرد.

### پرسیار

١ — ئایە هاوکاری کەسی خۆت دەکەیت لە کارەکانیماڵەوە وەک چۆن شاناز و خوشکەکەی یارمەتی دایکیان دەدا؟

٢ — ئەرکەکانی قوتابخانە بە دڵسۆزی ئەنجام دەدەیت وەک سازان؟

### بخوێنەرەوە و پاشان بینوسەوە

هەمیشە داوا لە خودای گەورە دەکەین بمانپارێزێت لە هەموو ناخۆشییەک

... ................ ................ ................... ....................

... ................ ................ ................... ....................

... ................ ................ ................... ....................

**راهێنان**

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕبکەوە:

پشت بەخودا دەبەستین تا هەمیشە بە دوورمان بگرێت لە ......... ئەوانەی .........
دەخەنە دڵی خەڵکەوە. هەروەها لە .......... ئەوانەی ئاوات بۆ نەمانی ئەو .............
دەخوازن خودا بەخشیوێتی بەبەنەدەکانی .

**سورەتی (الناس)**

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

قُل أَعُوذُ بِرَبِ النَّاس(١) مَلِكِ النَّاسِ(٢) إِلهِ النَّاسِ(٣) مِنْ شَرّ الوَسوَاسِ
الخَنَّاسِ(٤) الَّذِي يُوَسوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ(٥) مِنَ الجِنَّةِ وَالنَّاسِ(٦).

**راڤە**

بلێ پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەلکی، پادشای خەلکی، خودای خەلکی

موسڵمان هەمیشە پەنا دەباتە بەر خودا بۆ ئەوەی بیپارێزێت لە تاوانکاران و خراپەکاران و ئەوانەی هانی خەڵک دەدەن بۆ کاری نا بەجێ، ئەوانەی نێوان خەڵکی تێکدەدەن بە شێوازی جۆرا و جۆر،و لەوانەی ئێرەیی بە خەڵک دەبەن و ئاواتخوازن ئەو خێرەی خودا بە خەڵکی بەخشیوە بفەوتێت و نەمێنێت.

**ئامانجی وانەکە:**

قوتابییان هان بدرێن بۆ هاوکاری لەگەل کەس و کاریان لە ماڵەوە و لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی قوتابخانە دڵسۆزبن.

# چیرۆکی بانگدان

## وانەی دەیەم



لە سەرەتای ئیسلامدا موسڵمانان بۆ نوێژکردن کۆدەبوونەوە لە کاتی دیاریکراودا، بە بێ بانگکردن، بەڵام کە ژمارەیان زۆر بوو، پێغەمبەر(د.خ) بیری لە شێوازێک کردەوە بۆ بانگکردنی خەڵک بۆ نوێژ، هەندێک لە موسڵمانان پێشنیاریان کرد ئاڵایەک هەڵدات لە کاتی نوێژدا، کاتێک کە موسڵمانان دەیبینن بۆ نوێژ دێن ، بەڵام پێغەمبەر(د.خ) بە دڵی نەبوو، هەندێکیان گوتیان: شەیپور بە کار دێنین بۆ بانگکردن بۆ نوێژ وەک جولەکەکان، بەڵام پێغەمبەر(د.خ) ئەمەشی بە دڵ نەبوو.

هەندێکی دیکە گوتیان:

- زەنگ بە کاردێنین و لێی دەدەین تا موسڵمانان بزانن کاتی نوێژ هاتووە.

عەبدوڵڵای کوری زەید(ر.خ) کە یەکێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەوێ ئامادەبوو، موسڵمانێکی باوەڕداربوو خودا و پێغەمبەری زۆر خۆشدەویستن، زۆر لە خودا ترس بوو لە کارەکانی. عەبدوڵڵای کوڕی زەید(ر.خ) ئەم قسانەی گوێ لێ بوو و گەڕایەوە ماڵی خۆی، لە ماڵەوە تا خەوی لێکەوت بیری لە چارەسەرکردنی ئەم پرسە دەکردەوە.

کاتێک نوست خودا وشەکانی بانگی خستە دڵی وە ئەویش سبەینێ زوو چووە خزمەت پێغەمبەر (د.خ)و بۆی باس کرد.



پێغەمبەری خودا (د.خ) داوای لە عەبدوڵای کوڕی زەید کرد بیلال فێری ئەم وشانە بکات بۆ ئەوەی بانگ بدات، عەبدوڵای کوری زەیدیش بەم کارە هەستا. بیلال (ر.خ) یەکەم بانگی دا:

اللّٰه أكبر اللّٰه أكبر اللّٰه أكبر اللّٰه أكبر.

أشهد أن لا إله إلا اللّٰه أشهد أن لا إله إلا اللّٰه.

أشهد أن محمدًا رسول اللّٰه أشهد أن محمدًا رسول اللّٰه.

حيَّ على الصلاة حيَّ على الصلاة.

حيَّ على الفلاح حيَّ على الفلاح.

اللّٰه أكبر اللّٰه أكبر.

لا إله إلا اللّٰه.

**گفتوگۆ**

- بۆ چی موسڵمانان بیریان لە شێوازێک دەکردەوە لە کاتی نوێژدا کۆیان بکاتەوە؟
- بۆ چی پێغەمبەر (دخ) بە پێشنیاری هاوەڵەکانی رازی نەبوو؟

**پرسیار**

- ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر(دخ) کێ بوو کە خەونێکی بینی و بەهۆی ئەوەوە فێری بانگ بوو؟
- کێ بو یەکەم جار لە مێژووی ئیسلامدا بانگی دا؟
- لە رۆژێکدا چەند جار بانگ دەدرێت؟

# دەستنوێژ

وانەی یازدەم

ڕۆژانە باوکی شوان چەند جارێک دەست و ڕوخسارو باسک و پێیەکانی دەشوشت، بەم کارە سەرنجی شوانی ڕادەکێشا، بۆیە ڕۆژێک لە باوکی پرسی، مەبەستی لەو کارە چییە؟ ئەویش دوای تەوا بوونی، ئاوەکەی گرتەوەو، گوتی: نەدەبو لەو کاتەدا وەلامت بدەمەوە چونکە دەستنوێژم دەشوشت بە نیازی نوێژکردن و لەو کاتەشدا قسەکردن پەسەند نیە.
شوان پرسیارێکی کرد: بابە گیان دەستنوێژ چییە وچۆن دەبێت؟
باوکی گوتی: کورم دەستنوێژ لە مەرجەکانی نوێژەو پێویستی بە نیەتەو بەم شێوەیە دەبێت:
دوای گوتنی:



بسم الله الرحمن الرحيم
(بەناوی خودای بەخشندە)

سەرەتا دەستەکانمان جوان دەشۆین بە ئاو



پاشان سێ جار ئاو لەدەم وەردەدەین



دوای ئەوە سێ جار ئاو
لە لوتمان وەردەدەین



پاشان شوشتنی روخسارمان لەسەرەوە
بۆ خوارەوەی ٣ جار



ئینجا ٣ جار ئاو دەکەین بەباسکی راستدا
تا دەگاتە سەر پەنجەکان لە ئانیشکەوە.



باسکی چەپیش بەهەمان شێوە



پاشان دەستی تەڕ هێنان بەسەردا



ودوایی هەردوو گوێ خاوێن دەکەینەوە



دواجار شوشتنی پێی راست
تا قولەپێی (پاژنە) وپاشان پێی چەپ.

شوان : مەرجە دەستنوێژمان هەبێت کاتی نوێژکردن؟

باوکی شوان : بەڵێ، دەستنوێژ مەرجی نوێژکردنە و دەبێت خۆمان پاکژ بکەینەوە، چونکە ئاینەکەمان فەرمانمان پێ دەکات بە خاوێنی، و هەموو ئەم کارانە بەدەنگێکی نزم وئارام بن، نە بادە نووستویەک لە خەو راچەنێنین یان نوێژکەرێک بێزار بکەین.

خودای گەورە فەرموویەتی:(( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ...))

( المائده ٦)

## راهێنان

١- بە وشەی (رازیم )یان (نارازیم) کەوانەی بەرامبەر رستەکان پڕبکەرەوە.

کاتێک دەچم بۆ مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژ، ئەوا:

ئـ- هێدی هێدی دەڕۆم ( )

ب- بەڕاکردن و خێرایی دەڕۆم تا کاتی نوێژکردنی نەڕوات ( )

پ- پێش هاتنی کاتی نوێژ بەماوەیەک، لەماڵەوە دەردەچم بۆ مزگەوت ( )

٢- نیشانەی (√) بەرامبەر دەستەواژەی راست دابنێ و نیشانەی (×) بەرامبەر دەستەواژەی هەڵە دابنێ.

کەدەچینە مزگەوت بۆ نوێژکردن:

ئـ- پۆشاکمان خاوێن بێت ( )

ب- بە پێی راست دەچینە ژوورەوە ( )

پ- هەوڵی ریزی یەکەم دەدەین ( )

## چالاکی

قوتابی خۆشەویست: هەوڵبدە لەگەڵ هاورێکانت دەستنوێژ بشۆیت و پێکەوە نوێژ بخوێنن.

# کردەوەکانی پەیوەست بە نوێژ

## وانەی دوانزەم





شکۆ و باوکی چوونە مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژ، هەرکە چونە ژووری، شکۆ لە باوکی پرسی: باوکە ئێستا چی دەکەین؟، ئەویش گوتی: کوڕم، ئێستا نوێژ دەکەین.

شکۆ و باوکی نوێژی نیوەڕۆیان کرد و گەڕانەوە ماڵەوە.

سارای خوشکی لێی پرسی: لە گەڵ باوکم لە کوێ بوون؟

شکۆ: لە مزگەوت بووین نوێژمان دەکرد.

سارا: براکەم دەکرێت فێری نوێژم بکەیت؟

شکۆ: بێگومان خوشکەکەم، چونکە نوێژ ئەرکی هەموو موسڵمانێکە پاش ئەوەی تەمەنی دەبێتە حەوت ساڵ، نوێژیش بەم جۆرەیە:

لە شوێنی خاوێندا روو دەکەیتە (کەعبە) کە رووگەی موسڵمانانە ونیەتی ئەو نوێژە دێنیت کە مەبەستە و دەڵێت (الله اكبر) ئیتر بێ ئەملا ولاکردن دەستی راست لەسەر پشتی دەستی چەپ دادەنێت و سورەتی (فاتحة) و پاشان سورەتێکی دیکەی کورت دەخوێنیت.

دوای ئەوە بە وتنی (الله اكبر) دەچیتە (رکوع) کەبریتیە لەوەی هەردوو لەپی دەست بخەیتە



سەر هەردوو ئەژنۆو سێ جار بڵێت
(سبحان ربي العظيم)



ئینجا راستبونەوەو گوتنی
(سمِعَ اللّه لِمَن حَمِده. ربّنا ولك الحمد).



پاشان بە وتنی (الله اكبر)

کڕنووش بۆ سەر زەوی بۆ وتنی (سبحان ربي الاعلى) سێ جار، ئینجا هەڵسانەوە لە (کڕنووش) ودانیشتن بە وتنی (الله اكبر)، دووبارە چوونەوە کڕنووش بە (الله اكبر).

ودوای لەکڕنووش هەستانەوە بە (الله اکبر) و دەستکردنەوە بە خوێندنی سورەتی فاتحە و، ڕکاتی دووەم بەهەمان شێوەی ڕکاتی یەکەم ئەنجام دەدەیت و لە دانیشتنی ڕکاتی دووەم سڵاو ناردن (تحیات) دەخوێنیت بەم شێوەیە:

التحيات المباركات . الصلوات الطيبات لله . السلام عليك ايها النبي ورحمة الله وبركاته . السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين .

اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمداً رسول الله.

لە دوا ڕکاتی هەر نوێژێکیش لە پاش سڵاو ناردن (تحیات)و گەواهی ئەم نزایە دەخوێنیت:

اللهم صل على محمد وعلى آله كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم.

وبارك على محمد وعلى آله كما باركت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم، في العالمين انك حميد مجيد.

ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار.





پاشان سەلامی لای ڕاست دەداتەوە و دەڵێت

( السلام عليكم ورحمة الله و بركاته)

( السلام عليكم ورحمة الله و بركاته)

چالاکی :

١- نیشانەی (√) بەرامبەر دەستەواژەی ڕاست دابنێ و نیشانەی (×) بەرامبەر دەستەواژەی هەڵە دابنێ.

موسڵمان ڕۆژانە:

چوار جار نوێژ دەکات ( )

دوو جار نوێژ دەکات ( )

پێنج جار نوێژ دەکات ( )

٢- وشەی گونجاو بۆ بۆشاییەکان دادەنێم

(فاتحە، کورت )

لەهەر ڕکاتێک سورەتی ............ وپاشان سورەتێکی .............. دەخوێنرێت.

زانیاری

١ – نوێژی بەیـانیان دوو ڕکاتە.

٢- نوێژی نیوەڕۆ چـــوار ڕکاتە.

٣ – نوێژی عەسر چـــــوار ڕکاتە.

٤ – نوێژی مەغـــریب سێ ڕکاتە.

٥- نوێژی خەوتنان چوار ڕکاتە.

ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕبکەوە:

( سڵاو- لە ئامێز- یارمەتی-زەوی )

پێغەمبەر(دخ) لە سەر ........دادەنیشت و.........خێزانەکانی لە کاری

ماڵەوە دەداو نەوەکانی.......دەکرد، ئەگەر منداڵانی بدیتبایێ.........ی لێ دەکردن.

نــــزا

(خودایە وەک چۆن ڕوخسارمت جوان کردووە ڕەوشتیشم جوان بکە).

# هاوكاری خاوەن پێداویستی تایبەت

## وانەی سیانزەم

ئاینی ئیسلام موسڵمانان هاندەدات یارمەتی هەموو خەڵكی و بە تایبەتی خاوەن پێداویستیە تایبەتەكان بدەن، لەگەڵیان نەرم و بە بەزەیی وبە سۆز بن. چونكە ئەوە ئەركێكی ئاینیە و ئاینی ئیسلام هەموو خەڵك و بە تایبەتی موسڵمانان هاندەدات بۆ ئەنجام دانی كاری چاكە بە هەموو شێوەكانیەوە.

چونكە لەو ئاكارە باشانەیە كە موسڵمانان پێی ناسراون، پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: (**اللّٰه في عون العبد مادام العبد في عون اخيه**)) واتە: خودا هاوكاری بەندەی خۆیەتی گەر ئەو بەندەیە هاوكاری برای خۆی بوو.

موسڵمان دەبێت هاوكاری برایانی خۆی بكات كاتێك پێویستیان بە یارمەتی دەبێت، دەستی ونبـــوان بگرێت و رێی راستیان نیشان بدات كە دەیانەوێت بۆی بچن و یارمەتییان بدات لە هەڵگرتنی شمەكەكانیان.

موسڵمان دەستی نابینایان دەگرێت و لە شەقام دەیانپەڕێنێتەوە.

**چالاكی**

١- وشەی (رازیم) لەكەوانەی بەردەم دەستەواژەی دروست و (ناڕازیم) لە كەوانەی بەردەم دەستەواژەی نادروست دەنوسم.

نەرم ونیانی لەگەڵ ئاژەڵان (      )

هاوكاری لەگەڵ كەس و كار (      )

گاڵتەكردن بە كەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت (      )

سۆزداری لەگەڵ لێقەوماوان (      )

ئاگادارنەبوون لە كاتی وانەكان (      )

٢- برگەی ستونی لای راست بەبرگەی گونجاو لە ستوونی لای چەپ دەگەینم:

| | |
|---|---|
| موسڵمان هاوكارە | چونكە پشیلەیەكی بەند كرد تاكو مرد |
| یارمەتی خاوەن پێداویستییە تایبەتەكان | بۆ خاوەن پێداویستییە تایبەتەكان |
| ژنێك چوە دۆزەخەوە | كردەوەكان دەڕازێنێتەوە |

٣- ئەم فەرموودە پیرۆزەی خوارەوە بنووسەوە :

پێغەمبەرمان محەمەد (د.خ) فەرموویەتی: (دخلت امرأة النار في هرة حبستها، فلا هي أطعمتها، ولا هي تركتها تأكل من خشاش الارض).

نزا

( خودایە شیفا بۆ نەخۆشەکانمان بنێرێت و یارمەتی لێقەوماوان بدەیت)

زانیاریەک

یارمەتی دانی خاوەن پێداویستییە تایبەتییەکان ئەرکێکی ئاینی ومرۆییە.



# چیرۆکی فیل سوارەکان

## وانەی چواردەم



ئەبرەهەی کوڕی سەباح فەرمانڕەوای نەجاشی پاشای حەبەشە بوو لە وڵاتی یەمەن، بینی خەڵک لە ڕۆژانێکی دیاری کراودا خۆ ئامادە دەکەن و دەچنە شاری مەککە، بۆیە هەستا بە دروستکردنی کلێسایەک لە شاری سەنعا و ناوی لێ نا (القليس)، بۆ ئەوەی عەرەبەکان لە حەجدا بچنە ئەوێ: پیاوێک ئەم باسەی بیست هەستا بە شەو چووە ناو کلێساکە و رووگەکەی پیسکرد، ئەبرەهە وتی: کێ وێراویەتی ئەم کارە بکات؟ پێیان گوت عەرەبێک وای کردوە، ئەبرەهە سوێندی خوارد هێرش بکاتە سەر کەعبە بۆ ئەوەی بیروخێنێت.

داوای کرد لە نەجاشی فیلەکەی بۆ بنێرێت، نەجاشی فیلەکەی بۆ ناردو ئەبرەهەش بەڕێ کەوت بۆ مەککە، عەرەبەکان گوێبیستی ئەم هەواڵە بوون بۆیە خۆیان ئامادەکرد بۆ بە گژدا چوونی، بەڵام نەیانتوانی هێرشەکە رابگرن و ئەبرەهە شکستی پێیان هێنا.

سوپای ئەبرەهە مەڕ و ماڵاتی خەڵکی برد، ئەوە بوو دوو سەد حوشتری (عەبدولموتەلیب)ی باپیری پێغەمبەرمان (دخ) بەتاڵان برد.

ئەبرەهە پیاوێکی لە هۆزی حمیەر نارد بۆ لای خەڵکی مەککە و پێی گوت: بە گەورەکەیان بڵێ من بۆ جەنگ نەهاتووم تەنها بۆ روخاندنی (بەیت) واتە: کەعبە. هاتووم، پیاوەکە چووە لای عەبدولموتەلیب ئەمەی پێ راگەیاند، عەبدولموتەلیب وتی: توانای شەری ئەومان نیە بۆیە رێ لەو کارە ناگرین کە بۆی هاتووە، چونکە ئەمە ماڵی خوداو پێغەمبەر ئیبراهیمە، خۆی دەیپارێزێت.

ئەبرەهە فەرمانی بە سوپاکەی دا هێرش بەرن بۆ روخاندنی کەعبە.

خودا سوپای ئەبرەهە لە ناو برد
وە نەخۆشییەکی تووشی ئەبرەهە کرد بە هۆیەوە مرد.
خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (الفیل) باسی چیرۆکی فیل سوارەکانمان بۆ دەکات.

لەم چیرۆکەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ستەمکار هەرچەندە بەهێز بێت، خودای گەورە ناهێڵێت جەور و ستەمی تاسەر بێت وە لەناوی دەبات وە ستەم لێکراوان سەردەخات،

**پرسیار**

١ – ناوی ئەو کڵێسایەی ئەبرەهە دروستی کرد چیبوو؟
٢ – ئەبرەهە ئەو کڵێسایەی بۆ چی دروست کرد؟
٣ – بۆ چی ئەبرەهە ویستی کەعبە بڕوخێنیت؟
٤ – ئەبرەهە لە روخاندنی کەعبە سەرکەوت یان نا؟

**زانیارییەک**

ئەو ساڵەی ئەبرەهە ویستی کەعبە بروخێنیت بە ساڵی فیل ناسرا، لەو ساڵەشدا بوو کە پێغەمبەرمان موحەمەد (د.خ) لە دایک بوو.

بِسمِ اللّٰه الرَّحمنِ الرَّحيمِ

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ[١] أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ[٢] وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ[٣] تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ[٤] فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ[٥]

# لەناوە پیرۆزەکانی خودا

## وانەی پازدەم

الرحیم: دلۆڤانە و بە بەزەییە بۆ گشت بەندەکانی.

الوهاب: بەخشین و بەخششی بێ سنورە بۆ بەندەکانی.

الرزاق: رۆزیدەری گشت بونەوەرێکە.

الفتاح: دەروازەی خێرو خۆشی بۆ بەندەکانی دەخاتە سە رپشت.

العلیم: ئاگادار و زانایە بەهەموو شتێک



### چالاکی

دەینوسمەوە

الله الرحیم الوهاب الرزاق الفتاح العلیم.

....... .......... .......... ..........

....... .......... .......... ..........

....... .......... .......... ..........

### نزا

(خودایە لەدونیادا تەندروست ودورە بەڵام بکە و لەدوا رۆژیشدا بمخەرە ناو بەهەشت و نیعمەتەکانی)

........................................

........................................

........................................

# هاوكاری

## وانەی شازدەم

دوای ئەوەی ئەركەكانی قوتابخانەیان بەجێهێنا ساكار بە سۆرانی گوت: با بچین یاری بكەین،
سۆران: من هێشتا كارم ماوە، دەبێت باخچەكەی ماڵەوە پاك بكەمەوە پاشان دێم بۆ یاری.
باران: ئەگەر پێكەوە باخچەكە خاوێن بكەینەوە، كارەكە زوتر ئەنجام دەدەین و دەچین بۆ یاری كردن، هەر سێ هاوڕێ پێكەوە دەست بەكاربوون و بە ماوەیەكی كورت كارەكەیان تەواو كرد.
سۆران: سوپاس بۆ ئەم هاوكارییە.
ساكار: جگە لەیاریكردن، پێویستە هاوكاری یەكدی بكەین لەكاری چاكەو خاوێنی وراستگۆیی، ئەمانەن ئاكاری مرۆڤی موسڵمان.



بۆیە هەرسێكیان پێكەوە باخچەی ماڵی سۆرانیان خاوێن كردەوە سۆرانیش سوپاسی ئەو دوو هاورێیەی كرد. باوكیشی سوپاسی كردن و گوتی: بزانە خودای گەورە فەرموویەتی: ((وتعاونوا على البر والتقوى)). المائدة-٢
واتە ئێوە لەناو خۆتاندا لە بواری چاكەكردن ولەخودا ترساندا هاوكاری یەكدی بكەن. پێغەمبەری خوداش هەمیشە هاوكاری هاوەڵانی دەكرد.
هەروەها سۆران وتی: ئیبراهیمی هاورێم ڕۆژێك لەگەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە گەسێكی نابینای بەدی كرد هێندەی نەمابوو بكەوێتە چاڵێكەوە، دەست بەجێ چوو بە پیریەوە و دەستی گرت و بە وشەی جوان سڵاوی لێكردو پەڕاندیەوەو ڕزگاری كرد و پیاوەكەش زۆر سوپاس و نزای خێری بۆ كرد.

## زانیاری

خوداو پێغەمبەر (د.خ) مرۆڤی هاوکاریان خۆشدەوێت و ئێمەش کە موسڵمانین هەردەم دەبێت هاوکاری برا موسڵمانەکانمان بکەین.

## راهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە

١- بۆچی سۆران بە ساکاری گوت : ئێستا من ناتوانم یاریت لەگەڵ بکەم؟
٢- چۆن هەرسێکیان لە ماوەیەکی کورتدا کارەکەیان ئەنجامدا؟
٣- هۆی چی بوو ساکار هاوکاری سۆرانی کرد؟
٤- بەپێی ئایەتی (وتعاونوا علی البر والتقوی) ئایا پاکژ کردنەوەی باخچەکە کارێکی باش بوو؟
٥- گەر ساکار و سۆران هاوکاری یەکتریان نەکردایە، کاتی یاریکردنیان بۆ فەراهەم دەبوو؟

وشەی (رازیم ) یان (نارازیم) لە کەوانەکانی لای خوارەوەدا بنوسە :

هاوکاری کارێکی چاکە ( )
سۆزو بەزەیی لە گەل هەژاران ( )
بەئاگانەبوون لە زیانمان دەپارێزێت ( )

## نزا

خودایە کۆمەکمان بکە لە هەوڵدانمان بۆ سەرکەوتن

## چالاکی

هەر قوتابییەک ئاماژە بۆ کارێک دەکات ئەنجامی دابێت بە هاوکاری لەگەڵ باوکی، یان دایکی، یان براو خوشکی، یا هاورێکەی.

# سورەتی فەلەق

وانەی حەڤدەم

بسم الله الرحمن الرحيم

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ(١) مِن شَرِ مَاخَلَقَ(٢) وَمِن شَرِ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ
(٣) وَمِن شَرِ النَّفاثاتِ فِي العُقَد(٤) وَمِن شَرِ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ(٥).

راڤە

من خۆم دەپارێزم بەخودا لەشەڕو بەدکاری هەموو بەدیهاتوان و هەروەها لە شەڕی تاریکی زۆرو هەروەها لەبەدی وزیانی جادوکەران کەفوو بەگرێدراودا دەکەن بۆ فریو دانی مرۆڤەکان، لەشەڕی ئەو کەسەی ئێرەیی دەبات لەو کاتەی ئێرەیی دەبات.

## راهێنان

بۆشاییەکان بە وشەی گونجاو پربکەرەوە

پەنا دەگرم بە.............ی گەورە لەشەڕی ............. و............. وزیانی جادوکەران کە دەیانەوێت ............ فریو بدەن وله ............ حەسودان کە ئێرەیی بەکەسانی دیکە دەبەن.

## نزا

خودایە....... کۆمەکمان بە، بمانپارێزە لەبەدکاران و چاوی بەد



# وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا

**(طه ١١٤)**

# ناوەڕۆک